# دیاردەکانی دەنگی (د) لە شێوەی سلێمانیدا

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

بەغدا - ٢٠٠٠

لـه نێـو بـازنــەی دیـاردە جـۆربـەجـۆرە ( فـۆنـە تیـکـی )[1] و (فۆنۆلۆژی)[2] یـەکـانی شێـوەی سلێمانیــدا ، دەنگــی ( د ) فۆنێمێکـی یە کجار بەرچاو و سەرنج ڕاکێشە ...

---

(١) (فۆنەتیك) لە وشەی (Phonetikos ـ دەنگی) یۆنانیـیەوە کەوتووەتـەوە ، کە لە (Phone ـ دەنگ)ەوە وەرگیراوە . فۆنەتیك ئەو بەشەی زمانناسـییە ، کـە لـە دیـوی دەنگیـی زمـان دەکۆڵێتـەوە . جیـاوازی لەگــەڵ بەشــەکانی دی زمانناسیدا لەوەدایە ، ئەم (واتە ـــ فۆنـەتیك) تـەنیا لـە ئـەرك و دەوری زمـانی نـاڵوێ ، بـەڵکو ئـاوڕ لـە ڕووی مـادیی بابەتەکـەش دەداتـەوە : کـاری ڕشــتەی ئاخاوتن ؛ خاسیەتی دەنگیی دیاردەی بیستن ...لەبەر ئەوە فۆنەتیك هەروەها پێوەندیـی بـە چـالاکیی نـا زمانییشــەوە هەیــە : ئەنــەتۆمی و فــیزیۆلۆژیی پـەیدابوون و دروسـت بوونـی ڕشـتەی ئاخــاوتن و بیســتنەوە . فۆنــەتیك وەك زمانناسی بە گشـتی پێوەنـدی بـە دەروونناسـییەوە هەیـە ، چونکـە چـالاکیی ئاخاوتن بەشێکە لە چالاکیی دەروونیی ئادەمیزاد .

(٢) (فۆنۆلۆژی) لە زمانی یۆنانییەوە وەرگیراوە و لە (Phone ـ دەنگ) و (Log ـ زانست) پێکـهاتووە . بەشێکە لـە زمانناسـی . زانسـتێکە دەربـارەی پێکـهاتنی دەنگـی زمـان و لـە دروسـت بـوون و ئـەرکی بچووکـترین دانـەی بێواتـای زمـان (فۆنێم ، برگە) دەکۆڵێتەوە . جیـاوازیی فۆنۆلـۆژی لـە فۆنـەتیك لەوەدایـە ، کـە فۆنۆلـۆژی گرنگـی بـەوە نـادات دەنگـەکانی ئاخـاوتن لـە ڕووی فیزیۆلۆژییـەوە بناسێنێ ، بەڵکو مەبەسـتی نیشـاندانی دەور و ئـەرکی ئـەو دەنگانەیـە ، کـە لـە ئاخاوتندا بەر گوێ دەکەون ، واتە کە دەبنە ماك و کەرەستەی دانـەی ئـاڵۆزتر و واتـاداری وەك (مۆرفیـم ، وشـە) . هـەر لەبـەر ئەوەشــە ، هــەندێ لـە زانایــان فۆنۆلۆژییان بە (فۆنەتیکی ئەرکی) ناوبردووە .

ئەوەتە لەو یاسا هەمەچەشنانەی خوارەوەدا کاریگەرە و خۆی دەنوێنێ :

ـ ١ ـ

## تێچوون

زۆر جار ئەوە بەرگوێ دەکەوێ ، کە دەنگی (د) ناوترێ ، یاخود کلۆردەکرێ ، وەك : (منال) لە بریتی (مندال) ؛ (مەحموو) لە جیاتی (مەحموود) ؛ (کرانی) لەباتی (کراندی) ؛ (زامار < زامدار) ؛ (بەسەرما < بەسەرمدا) ...

لەبارەی قۆناغەکانی تێچوونی ئەو جۆرە (د)انەوە ، ئەوە دەخەینە بەرچاو ، کە نالی لە سەرجەمی شیعرەکانیدا (جگە لە وشەی ((چەن))[٣] نەبێ) ، ئەو (د)انەی وتووە . بە وێنە ، بڕوانە : (ل١٣٢ ، د ١ ــ ((لە سینەمدا)) )[٤] ؛ (ل١١٣ ، د ٤ ــ((بدە))) [٥] ؛ (ل٥٩٥ ، د ٤ــ((تێدا))[٦] ؛ (ل٥٢٠ ، د ٤ ــ ((بە ڕووی ڕۆژدا)) )[٧] ... هتد .

---

(٣) چاوەکەت ئاگر لە سینەی عاشقی میسکین دەکا
مەستە ، مەیلی چەن کەبابێکی دڵی خوێنین دەکا
( ل ١١١ ، د ٤ )

(٤) تیری موژگانت لە سینەمدا دەچێ بۆ پیری دڵ
هێندە کەچ ئایینە قەصدی خانەدانی دین دەکا

(٥) جێی دەم دەمە ، جێی لەب لەبە ، ساقی وەرە ئەمشەب
هەم ماچی دەمامەم بدە ، هەم جامی لەبالەب

(٦) مەدرەسە ، مەحبەسەیە ، مەبحەثەیی وەسوەسەیە
کەسی تێدا هەیە ، ئەمما خۆش و خورسەندی نییە

(٧) لەولاوێکە لەو لاوە بە ئەم لاوە کشاوە ،
یا یاسەمەنی خاوە بە ڕووی ڕۆژدا ڕژاوە ؟!

سەرنج راکێش ئەوەیە تێچوونی ئەم دەنگە زۆر بە خێرایی جێگیر بوو ... ئەوەتە نالی لە تاکە وشەیەکدا سواندوویەتی ، کەچی مەحوی ، کە ماوەیێکی کورت بە دوا نالیدا دێ ، پتر لە ٦٠٪ یاندا قرتاندوونی.بۆ نموونە ، بڕوانە ( ل ٨ ، د ٢ ــ((بەدارا)) )[٨]؛(ل ١٠ ، د ٦ ــ((لەسەر ئەرزا)))[٩]؛(ل ٧٠، د ١ـ((بە سەرا)))[١٠] ؛(ل ٢٠٥ ، د ٢ ـ ((لەشارا)) )[١١] ؛ (ل ٢٨٧، د ٣ ـ ((مەهی ڕوخساریا)) [١٢] ؛ ( ل ٢٩٢ ، د ٥ ـ (( بە سەرما )) [١٣] ؛ ( ل ٣٠٢ ، د ٥ ــ (( لە باغا )) )[١٤] ؛

---

(٨) هەتا حەق ناصیرە ، هەر حەقمە مەنصوور

وەکوو ( مەنصوور ) ئەگەر بمکەن بە دارا

(٩) کە شك بەم (( مەحویا )) هەر شەربەتی مەرگ

لەسەر ئەرزا نیە ئاوی گەوارا

(١٠) قوربێ بکەم بە سەرا یا بە دادڕینی بەرۆك

حەقی مەحەببەت ئەداکەم ، بدەی خودایا دەست

(١١) چ شۆرێکی جونوونی پێوەیە بای ئەم بەهارانە

لە شارا هەر زنەی زنجیرە ، صەحرا شۆڕشی بولبول !

(١٢) وەك شەو کشا بەسەر مەهی ڕوخساریا خەتی

گیرا ئەم ئافتابە کە قەت بەرنەبێتەوە

(١٣) پێی بە سەرما نا کە بوومە خاکی ڕێی ، گەردم شوکر

گەییە داوێنی ، دەڵالیی بای شەماڵم بۆ چیە !

(١٤) بەوەم زانی لە باغا چقڵی گوڵ هەڵچەقیە داوێنی

کە لێرە دڵ لە سینەمدا برینی نەشتەری دێشێ

( ل٣٦٢ ، د ٥ ـ ((لە ناو باغی بەهەشتا)) [١٥]؛( ل٣٦٤ ، د ٢ ـ ((لـە بـەزمی ئەمشەوا)) ) [١٦]؛ ( ل ٤٦٣ ، د ٦ ـ ((بە لاما)) [١٧] ... هتد [١٨] ...

---

(١٥) ناوی زەنەخدانت لەناو باغی بەهەشتا بێتە نێو
سەر دەردەگێڕێ باخەوان هەر جێبەجێ بۆ تف لە سێو

(١٦) درۆیە مەنعی جەمعی صید ، ئەصەر کەن
لە بەزمی ئەمشەوا پێشێ دیارە

(١٧) بە دەردی خۆمەوە گەر گۆشەیەك دەگرم بە بێدەنگی
بەلاما دێ بە خەشم و ڕق ، دەڵێ : خۆ نەقشی دیوارە

(١٨) چەند نموونەیێکی حاڵەتی تێتەچولندن :
ئەرێ دڵ بێ شەرابی لەعلی گوڵ ڕەنگت لە گوڵ چبکا ؟!
کە جیلوەی گوڵ لە گوڵشەندا نەبێ ، بولبول لە چڵ چبکا ؟!
( ل ١٣ ، د ٦ )

لە بەنگ ئەم بەنگییانە چی دەبینن : خۆ لە خۆ گۆڕان
لە دنیادا مەداری عەیش و خۆشی : خــۆ نەنـاســینە
( ل ٢٨٤ ، د ٤ )

لەو ڕۆژەدا شەفاعەتی چاکانە جێی ئومێد
بۆ عاصییان و ئەهلی کەبائیر لە موئمینین
( ل ٢٩٤ ، د ١ )

لەبۆ سەیرانی باغ و سەبزە تەکلیفم مەکەن یاران
کە سەبزە و گوڵ لە چاومدا بە بێ ئەو هەر خەس و خارە
( ل ٤٦٣ ، د ٢ )

شایانی باسە ، ڕۆژنامەی ((تێگەیشتنی ڕاستی)) پیتی (د)ی ئەو جۆرە وشانەی نووسیوە . بەوێنە ، بڕوانە : ( ژ ١ ، ل ١ ، س ١ ، د ١٦ ـ ((خاوەند)) ؛ ( ژ ١ ، ل ١ ، س ١ ، د ٢٢ ـ ((دەیان ناڵاند)) ) ؛( ژ ١ ، ل ١ ، س ٢ ، د ١٦ ـ (( دایان مەزراند)) ) ؛ ( ژ ١ ، ل ٣ ، س ٢ ، د ٢ ـ (( پەلامار بداتە)) ) ؛ ( ژ ٣ ، ل ١ ، س ١ ، د ١٦ ـ (( نواند))؛( ژ ٢ ، ل ١ ، س ٢ ، د ١ـ((چند)) ) ؛ ( ژ ٤ ، ل ١ ، س ١ ، د ٧ ـ (( تیدا)) ؛ ( ژ٤ ، ل ٢ ، س ٢ ، د ٢ ـ(( لە فلسطیندا ، لە عراقدا))) ؛ ( ژ ٥ ، ل ١ ، س ١ ، د ١٩ ـ(( دولتاندا)) ) ؛ ( ژ ١٤ ، ل ١ ، س ١ ، د١٢ ـ (( دامەزراندنی))) ....جاروباریش ئەو (د)انەی نەنووسیوە ، بەوێنە بڕوانە : ( ژ ٢ ، ل ١ ، س ١ ، د ٢٠ ـ (( لیاشا))) ؛ ( ژ ٣ ، ل ١ ، س ١ ، د ١٩ ـ ((شتیکا))...

دیارە مێجەر سۆن لەمەشدا هەر شێوەی لەباری هەڵبژاردووە . با شێوەی سلێمانی بناخەی زمانی ئەدەبیشمان بێت ، بەڵام نە ئەو شێواندنە و ، نە ئەو تایبەتێتی‌یە ناوچەیی‌یە ڕاست نییە لە نووسین و زمانی نووسیندا شوێن پێیان دیار بێ . مامۆستا تۆفیق وەهبیش لەم بارەیەوە نووسیویێتی : (( (د)ی کلۆر دەبێ بەجارێ بکرێتە دەرەوە لە زمانە ئەدەبیەکەمان ؛ وە لەو جێیانەشدا کە (د)ە کلۆرەکان کەوتوون ، یان گۆڕاون بە دەنگێکی تر ، (د)ی پتەو بخرێتەوە کار )) [١٩] .

---

(١٩) تۆفیق وەهبی ، ئەسڵی پیتە قاڵبی (ئە)ی شێوەی سلێمانی ، ((گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد)) ، ب ١ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٣١

هەرچی (گۆران)یشـە یـەکجارەکی (جگـە لـە دوو حاڵـەتی ((لـە دێدا))[20] و ((خاوەند)) دا[21] نەبێ) بە کلۆری دەری بڕیـوون ... چـەند نموونـەیێك : (ل ١١ ، د ٣ ــ ((چـــەن))[22] ؛ (ل ١٦ ، د ٨ ـ ((زەمـاوەن))[23]؛(ل ١٦ ، د ١٠ ــ ((لـــە ڕێـی جوانیتـا))[24] ؛ (ل٢٤ ، د ٣ ـ ((منا)))[25] ؛ (ل ٢٨ ، د ١ ـ ((شینا))[26]. ...

---

(٢٠) لە دێدا کام جێت گەورە بەرچاو کەوت
مالّی ئاغایە و خانەقا و مزگەوت
(ل ١٢٩ ، د ١٣)

(٢١) ئەی بت ؟ ئەی بتەوان ؟ شەیتان ؟
خاوەندانی دەزگا و دوکان ؟
(ل ٢٨٨ ، د ١٩)

(٢٢) چەن بە ئاهەنگ چەن سیحراوی
ئەگەڕێ قاز یان مراوی

(٢٣) گوڵ نەبێ بۆ سەرم : ئاڵ چەپکێ ، زەرد چەپکێ
نایەم بۆ زەماوەن ، نایەم بۆ هەڵپەڕکێ

(٢٤) کچ لە ڕێی جوانیتا ، کچ لە ڕێی جوانیتا
کچ لە ڕێی نیو نیگای هاتوچۆی کانیتا

(٢٥) نەبووی لە وزەی دەستکورتیی منا
ئاشکرا و دیارە

(٢٦) لە ژێر ئاسمانی شینا
لەپاڵ لووتکەی بەفرینا

( ل ۱۹۸ ، د ١٦ ـ (( دایکیا )) )[٢٧] ؛ ( ل ۲۰۰ ، د ١٤ ـ (( لـه ژێریا ))[٢٨] ؛ ( ل ۲۰۰ ، د ۱۹ ـ (( بیستەما )) )[٢٩] ؛ ( ل ۲۲۷ ، د ٥ ـ ((دەست باتە)) )[٣٠] ؛ ( ل ٢٩٦ ، د ١٥ ـ (( منالّان )) )[٣١] ؛ ( ل ۲۹۷ ، د ٦ ـ (( ئەلەرزان )) )[٣٢] ... هتد ...[٣٣]

---

(٢٧) ئەك دایكی كوڕ ــ مردوو ، دیم كژرپەی ساوا
لای مەیتی دایكیا ، فرمێسك لە چاوا

(٢٨) فرمانێك ... قەیناكا قورسیش بێ بە شانم
لە ژێریا لێك دەچێ گشت جومگەی ئێسقانم

(٢٩) زۆر شەرمە لە چەرخی بیستەما ئینسانێ
بێ‌ئیش بێ و سكی خۆی هەڵ لووشێ بۆ نانێ

(٣٠) تا دەست باتە دەست ئیستیعمار
بۆ مژینی خوێنی هەژار

(٣١) قەدەغە بوو لە منالّان
بۆ گۆی مەمك بەرن دەمیان

(٣٢) پلنگی نوو پێی دارستان
شارستانیەتیی ئەلەرزان

(٣٣) رۆژنامەی ((تێكەیشتنی ڕاستی)) ، كە ماوەی دوای (مەحوی) و پێش (گۆران)ە ، بە پێی ئەو ڕەوتە ، دەبوو هیچ نەبێ ٨٠٪ ی ئەو (د)انەی نەنووسیایە ـ واتە ٢٠٪ ی لە (مەحوی) پتر تێبچواندایە ... كەچی بەپێچەوانەوە زوربەی زۆری پیتی (د)ی ئەو جۆرە وشانەی نووسیوە ... وەك لە سەرەوە پەنجەمان بۆ ڕاكێشاوە ، وا پێ دەچێ مێجەر سۆن بە ڕاستی نەزانیوە ئەو تێ چوونەی لە ئاخاوتندا پەیدابووە ، لە زمانی ئەدەبیدا ڕەنگ بدلتەوە .

بەڕاستی سوان و تێچوونی (د) ڕوونکردنەوە و لێکۆڵینەوەی تەواوی دەوێ ،چونکە لە زۆر شوێنی دی وشەدا دەقرتێ .بەوێنە ئەمڕۆ ، بەتایبەتی لە ناوچەی سلێمانیدا دەنگی (د)ی ژمارەکانی ( یازدە ، دوازدە ، سیازدە ، پازدە ، شازدە ، حەڤدە) سواوە و دەوترێ ( یانزە ، دوانزە ، سیانزە ، پانزە ، شانزە ، حەڤڤە ) . لەبەرئەوەی تێچوونی ئەم (د)ە بووە بە هۆی قورسیی دەربڕینی ئەو وشانە ، بۆیە ئاخێوەر بۆ سووك کردنی ئەو نالەبارییە ناچار بووە دەنگی (ن) بێنێتە ناو ( یازە ، دوازە ، سیازە ، پازە ، شازە ) ەوە و (ڤ)ی (حەڤە)ش دووبارە بکاتەوە [٣٤] .

ئەسڵی ئەو وشانە کە ( یازدە ، دوازدە،سیازدە،پازدە ، شازدە ، حەڤدە ) ن [٣٥]، بێگومان چ بۆ نووسین و چ بۆ زمانی ئەدەبی ڕاست وایە

---

(٣٤) شایانی باسە ، مامۆستا مەسعوود محەمەد بە شێوەیێکی زانستی و بەڵگەی زۆر و ڕاست و لەبار دەربارەی چۆنیەتی نووسینی ژمارەکان دواوە (بڕوانە : مەسعوود محەمەد ، چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی ڕێنووس و ئەلفوبێی کوردی ، ((گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق ـ دەستەی کورد)) ، ب ٩ ، بەغدا، ١٩٨٢ ، ل ٢٤١ ـ ٢٤٤ .

(٣٥) لە زمانی ئاوێستادا ناوی ژمارەکان لە (١١)ەوە تاکو (١٩) بە لێکدانێکی ئاسایی ساز دەبێ ، ئەمەش بەڵگەیەتی :

پەنجەدەسە (پازدە)

خشڤەش دەسە (شازدە)

واتە تەواوی ژمارەی یەکان + دەسە .

(بڕوانە : س . ن . سۆکۆلۆڤا ، زمانی ئاوێستا ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، ل ٧٠)

پەیڕەوی ئەسڵەکەیانْ بکرێ . شایانی باسە کۆڕی زانیاری کوردیش لەو

---

-

لە زمانی کوردیدا ئەگەرچی لەم پێکهاتنەدا هەندێ گۆڕان لە ناوی بەشێ لە ژمارەکاندا ڕووی داوە ، بەڵام هەمان بنەما و دەستوور بەکاردێنرێ . بەوێنە :

چوار + دە = چواردە

هەشت + دە = هەژدە

نۆ + ز + دە

لە زمانە ئێرانییەکانی دیشدا ، هەر وەك زمانی ئاوێستا و زمانی کوردی ، ناوی ژمارەکانی نێوان (١١) و (١٩) دیسان لە یەککرتنی ناوی ژمارەی یەکان و ناوی ژمارەی (١٠) سازدەبێ ، لەگەڵ هەندێ گۆڕانی فۆنەتیکیدا . بەوێنە :

| فارسیی ناوەڕاست | فارسیی نوێ | بلووچی |
|---|---|---|
| ١١ـ یازدەه | یازدە | یازدەه |
| ١٢ ـ دوڤازدەه | دوازدە | دوازدەه |
| ١٣ـ سێزدە | سیزدە | سێزدەه ، سێنزدەه |
| ١٤ـ چەهاردەه | چهاردە | چاردەه |
| ١٥ـ پانزدەه | پانزدە | پانزدەه |
| ١٦ـ شازدەه | شانزدە | شانزدەه |
| ١٧ـ حەفتدەه | هفدە | هەوردەه |
| ١٨ـ هەشت دەه | هجدە | هەژدەه |
| ١٩ـ نەڤەزدەه | نوزدە | نۆزدەه ، نۆزد |

-

.......................................

- تێبینی :

١ـ لە زمانی ئاوێستادا ناوی ژمارەکانی (١١) تا (١٩) لە ڕێگەی یەکگرتنی ناوی ژمارەی یەکان + ناوی ژمارەی دەوە پێك دێ ؛ بێ ئەوەی هیچ گۆڕانێکی فۆنەتیکی ڕووبدات .

٢ـ ئەگەرچی زمانە ئێرانییەکانیش لە پێکهاتنی ناوی ئەو ژمارانەدا لەسەر هەمان دەستوور ڕۆیشتوون ، بەڵام هەندێ گۆڕانی فۆنەتیکی ڕووی داوە ... وێڕای ئەو گۆڕانە گشتییە ، دوو دەنگی (ز) و (ن) هاتوونەتە ناو بەشێك لە پێکهاتنەکەوە :

أـ دەنگی (ز) .

ئەم دەنگە تازە پەیدانەبووە ، بەڵگەش ئەوەیە نەك هەر لە زمانە ئێرانییە نوێکاندا هەیە ، بەڵکو لە فارسیی ناوەڕاستیشدا بەهەمان شێوە دەبینرێ و لە بەشێکی زۆری ناوی ژمارەکاندا بەشداری دەکا :

( یازدەه ، دوڤازدەه ، سێزدەه ، شازدەه ، نەڤەزدەه ) .

ب ـ دەنگی (ن) .

وا پێدەچێ دەنگی (ن) زۆر درەنگ هاتبێتە نێو پێکهاتنی ناوی ئەو جۆرە ژمارانەوە ، چونکە لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا بە هیچ جەشنێك نابینرێ . لە زمانی فارسیی نوێ و زمانی بلووجیدا تەنیا لە وشەی (شانزدەه)دا هەیە (هەرچی ((ن))ی وشەی ((پانزدەه))ە ڕەسەنە و هی ئەسڵی وشەکەیە ) ... لە زمانی کوردیشدا لەگەڵ ئەوەشدا کە لە هەموو شێوەکاندا نییە و پتر تایبەتە بە ناوچەی سلێمانی ، پەیدابوونی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی بیستەم .

( بۆ وەرگرتنی زانیاریی تەواو دەربارەی ئەو لایەنانەی ژمارەکانی زمانی کوردی ، بڕوانە : د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، ڕێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم (وشەسازی) ، بەشی چوارەم (ژمارە و ناوەڵکردار) ، بەغدا ، ١٩٩٨ ، ل ٧٥ ـ ٧٧ .

ڕایەدا بووە ، کە دەبێ (( ئە سڵی ئە و ژمارانە لە نووسیندا بپارێزرێت )) [36] .

تێچوونی ئەم ژمارانەش ، هەر وەك تێچوونی (د)ی هەندێ وشەی دی ، کە پێشتر باسمان کردن ، لە ساڵانی بیستدا لە گەڕدا بوو . بەڵگەش ئەوەیە کە لە چاپەمەنییەکانی ئەو سەردەمەدا شێوەی جیاوازی بەکارهێنانیان ــ واتە ئەسوان و سوان دەبینرێ . بەوێنە بڕوانە ، (( تێگەیشتنی ڕاستی )) : ( ژ ۲۱ ، ل ٤ ، س ۱ ، د ۲۹ ــ (( یازدە )) ؛ ( ژ ۱۷ ، ل ۲ ، س ۲ ، د ٥ ــ (( دوانزە )) ) [37] .... (( بانگی

---

۳٦ــ کۆڕی زانیاری کورد ، ڕێنووسی کوردی ،((گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد)) ،ب۱، ژ ۱ ، بەغدا ، ۱۹۷۳ ، ل ۲۷۰ .

۳۷ــ لە ((تێگەیشتنی ڕاستی))دا سەرنج ڕاگرتن لە ژمارەکان ، ئەو ڕاستییەشمان پێدەسەلمێنێ ، کە ئەو (ە)یەی هەندێ لە نووسەران دەیخەنە نێوان ژمارە و نیشانەی (ەم ، ەمین)ی پلەیانەوە ، شتێکی زیادەیە و لە لاوە هێنراوەتە ناوانەوە . لە گشت شوێنێك و تێکڕای وتارەکانی ((تێگەیشتنی ڕاستی))دا تاکە ژمارەیەك چییە (ە)ی لەگەڵ نەنووسراوە ، بەوێنە : (ژ ۲۱ ، ل ۱ ، س ۲ ، د ٦ ((دومین)) ) ؛ (ژ ۲۱ ، ل ۱ ، س ۲ ، د ۱٥ ــ ((سیمین)) ) ؛ (ژ ۲۱ ، ل ۱ ، س ۲ ، د ۲۰ ــ ((چوارمین)) ) ؛ (ژ ۲۸ ، ل ۳ ، س ۲ ، د ۲۰ ــ ((دومین)) ) ؛ (ژ ۲۸ ، ل ۲ ، س ۲ ، د ۲۸ ــ ((دوم)) ) ...

کوردستان )) : ( ژ ۹ ، ل٥ ، س ۱ ، د ۱۸ ــ(( دوازده ))؛ ( ژ ۳ ، ل ٦ ، س ۲ ، د ٤ ــ (( یانزه )) ...

... هتد . (۳۸)

---

ــ

هەروەها نەبینینی ئەو (ھ)ە لە چاپەمەنییە کوردییەکانی دی ئەو سەردەمەدا ، رای دانانی بە شتێکی زیاد و لە لاوە هێنراو پتەو دەکات . بۆ نموونە بڕوانە : ((ڕۆژی کوردستان)) (ژ ۱ ، ل ۲ ، س ۱ ، د ۲۷ ــ ((بیستەمین)) ...

۳۸ــ دیاردەی بوونــی ( د) بـە (ئــ) لە ساڵانی بیستدا چۆن گەشەی دەکرد و چۆن لە کەسێکەوە بۆ کەسێك جیاواز بوو ، تێچوونی (د)ش هەر بەو چەشنە دەبینرێ . دواتر نیشانمان داوە ، کە زوربەی نووسەرانی ئەو دەمە بە زۆری (دە)یان بەکار دەهێنا . جا گەڕان بە چاپەمەنییەکاندا ئەوە ئاشکرا دەکا ، کـە نووسینی (د)ش پـتر باوبوو . بـۆ ئەوەش کە لەو ڕووەوە جیاوازی لە نێوان نووسەراندا هەبووە ، تـەنیا پەنجە ڕاکێشان بۆ ئەوە بەسە ، کە لە هەموو ئەو وتارانەی ((تێکەیشتنی ڕاستی)) ، کە بەلامانەوە هی مێجەر سۆنن ، لە چەندین شوێندا وشەی (چــەند)ی بـە بـێ سـواندنی (د) نووسیوە ، بەڵام ئەو زانا کوردی لـە ژمـارە (١٦) و (١٧)دا وتـارێکی بڵاوکردووەتـەوە ، (چەن)ی بەکارهێناوە (بڕوانە : لحلق عالمێکی اجتماعی گەورەی کـوردان بـو رؤسـای عـالی قـدر کردان ، ((تێکەیشتنی ڕاستی)) ، ژ ١٦ــ١٧ ) .

دەنگی (د) جگە لەو تێچوونە ئاسایییەی ، گەلێ جار بە هۆی کارتێکردنی ئەو دەنگەشەوە ، کە بە دوایدا دێ ، ناوترێ ... بەتایبەت ئەگەر بکەوێتە پێش دەنگی (ت) یان (ك)ەوە . بە نموونە :

دت : زیادتر > زیاتر [٢٩]
بڵندتر > بڵنتر
.....

دك : زیادکردن > زیاکردن
بڵندکردن > بڵنکردن
.....

ـ ٢ ـ

## پەیدابوون

ئەم دیاردەیە تەنیا لە یەك حاڵەتدا دەبینرێ :

ئەو کردارانەی ڕەگی کاتی ڕانەبوردوویان بە دەنگی (ڕ) یان (ر) کۆتایی دێت ، لە کردنی بە کارا بزریدا ، ئاخێوەر هەندێ جار (د) دەخەنە نێوان ڕەگی کردارەکە و پاشگری (ـ ر)ی کارا بزرییەوە :

گۆڕرا ـ گۆڕدرا
هاڕرا ـ هاڕدرا

---

٢٩ـ لە کۆیا موددەعی دیمی ، بە ئیستیهزا وتی : شاهم !
گەدای ئەم کۆیە بم ، شاهنشەهێکم صەد لە شا زیاتر
( مەحوی ، ل ١٢٥ ، د٦ )

سپاروا ــ سپاردرا

ژمێررا ــ ژمێردرا

... [٤٠]

ـ ٣ ـ

## دەنگـەگـۆڕکێ

**١ـ د > ئـ**

ئاشکرایە لـە شـێوەی سـلێمانیدا نیشـانەی (دە)ی کـاتی ڕانەبوردوو و ڕابوردوویی بەردەوام دەبێ بە (ئە) . وەك :

دەڕۆم > ئەڕۆم

دەچم > ئەچم

دەزانم > ئەزانم

....

دەڕۆیشتم > ئەڕۆیشتم

دەچووم > ئەچووم

دەمزانی > ئەمزانی

.....

---

٤٠ـ بۆ وەرگرتنی زانیاریی تەولو لەبارەی ئەو جۆرە دیاردەیەوە ، بڕوانە :

أ ـ د . عەبدوڵڵا نەقشبەندی ، پاشکۆی (درا) ، ((گۆڤاری کۆڕی زانیاری کـورد)) ، ب ١ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ١١٥ـ١٢٧ .

ب ـ د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، کرداری کارا دیار و کرداری کارا بزر لە زمـانی کوردیدا ، ((گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق ـ دەستەی کـورد)) ، ب ٢٥ـ٢٦ ، بـەغدا ، ١٩٩٤ ، ل ٨٦ـ٨٧ .

ئەگەر بۆ دەست نیشان کردن و ڕوونکردنەوەی پلەکان و شێوەی گۆڕانی (دە) بە (ئە) ـ ڕاستتر (د) بە (ئـ) ـ گەشتێك بە دیوانی شاعیرانی کۆن و نوێی ناوچەی سلێمانیدا بکەین ، ئەوە دەبینین کە لە زوودا قالبی (دە) بەکارهاتووە و دوایی بووە بە (ئە) . لە تێکڕای شیعرەکانی نالیدا وێنەی (ئە) تەنیا لە یەك شوێندا دەبینرێ : ( ل ٢٨ ، د ٢ ـ ((ئەنالم)) [٤١] [٤٢].... بەڵام ئەگەر بەرەو پێش بێین ، ئەوە دەتوانین ڕەوڕەوەی ئەو گۆڕانە دیاری بکەین . بۆ نموونە لە شیعرەکانی مەحویدا هەرچەندە بە زۆری ( دە ) بەکارهاتووە [٤٣] ، بەڵام تاکە

---

(٤١) دەستم مەخە سەر ، تا قەدەمم سووتووە ، چارم !
یاخۆ بە شیفا هاتووی ؟ چەندێکە ئەنالم

(٤٢) وا تێدەگەم ئەو تاکە حاڵەتەش کاری نووسەری دەستنووسەکە بێ .

(٤٣) گەردی ڕێی هەستاوە جێ دلوا دەکا
بەختە ! ماڵی چاری کێ ئاوا دەکا !
( ل ٢٢ ، د ٣ و ٤ )

کە تۆ غایب لە بەرچاوم دەبی ، چم بێ لە تۆ غایب
قیامەت حاصری بەرچاومە ، خۆمم لە خۆ غایب
( ل ٥١ ، د ٥ )

هەم دەمکوژێت و دین و دڵیشم دەبا ، دەڵێ
من (مَنْ قَتَل ) ، ئەمیشە قەتیلم ، (لِیَ السَّلَب )
(ل ٤٩ ، د ١ )

لە خۆم و لەو کەسە خۆشم دەوێت و خۆشی دەوێم ،
خودایە ، خۆش ببی‌یو ، تۆ ببی خودایا ، خۆش
( ل ١٥٢ ، د ٢ )

... و گەلێکی دی .

تاکەیەك شێوەی (ئـە) ش دەبینرێ [٤٤] ... زێوەر کە ماوەیێك بە دوا مەحویدا هاتووە ، بەپێچەوانەوە بە زۆری (ئـە)ی بەکارهێناوە و دەنکە دەنکەیەکیش (دە)ی وتووە ... بێکەس ، کە کەمێك پاش زێوەر کەوتووە تێکڕا (ئـە)ی وتووە و بەهیچ چەشنێك لە شیعرەکانیدا (دە) نابینرێ.

لە کاتی دەرچوونی رۆژنامەی ((تێگەیشتنی ڕاستی))یەوە تا سالآنی ٣٠ دیاردەی بوونی (دە) بە (ئـە) بە شێوەیێکی سەرنج ڕاکێش دەبینرێ و لە نێوان نووسەراندا جیاوازی بەدی دەکرێ . زۆربەی نووسەرانی ئەم سەردەمە بە زۆری هێشتا (دە)یان بەکاردەهێنا و بەشێکیشیان پتر (ئە)یان دەنووسی ... مستەفا پاشا و ڕەفیق حیلمی و عەلی کەمال باپیر ... زیاتر بە لای (دە)دا دەچوون . بەوێنە وتارێکی مستەفا پاشا ، کە لە ژمارە (١)ی رۆژنامەی ((بانگی کوردستان))دا بە ناوی ((جەمعیەتی کوردستان ))ەوە بلآوکراوەتەوە [٤٥] ، حەوت نموونەی تێدایە ، کە شەشیان (دە)ن و تەنیا یەکێکیان (ئە)یە . لە ژمارە

---

(٤٤) وەقتی نوێژی سەر جەنازەی بۆ شەهیدی عیشق لۆست
مەوج ئەدا ئەم ئاسمانە لە دەنگی ( الصلا )
( ل ٢٨ ، د ٦ )
خەو ئەزانێ نیە ، دەیوت : دە بنوو بێمە خەوت
نێك بەختم بە وەنەوزێ بکە ، ئەی بەختە مەدەد
( ل ١١٣ ، د ١ )
... و هەندێکی دی .

(٤٥) مستەفا پاشا ، جەمعیەتی کوردستان ، ((بانگی کوردستان)) ، سالی ١ ، ژ ١ ، ٢ی ئابی ١٩٢٢ ، ل ١ـ٢ .

(٣) شدا وتارێکی هەیە [٤٦] ، (٣٠) نموونەی تێدایە ــ(٢٦)یان (دە)ن و تەنیا (٤)یان (ئە)ن . لە ژمارە (٤)یشدا وتارێکی بڵاوکردۆتەوە [٤٧] (٥) نموونەی تێدایە و هەر (٥)یان (دە)ن ... ڕەفیق حیلمی لەو شیعرەیدا ، کە لە ژمارە (٢)ی ڕۆژنامەی ((بانگی کوردستان))دا چاپی کردووە [٤٨] تێکڕا (دە)ی بەکارهێناوە ... عەلی کەمال باپیر لە وتاری ((تەربیەتی ئەولاد))دا [٤٩] (١٥) جاری (دە)ی بەکارهێناوە و (٩) جاریش (ئە) ... لەمانە و لە گەلێك نووسینی دی ((بانگی کوردستان)) و چاپەمەنی تری ئەو کاتەدا بە زۆری (دە) دەبینرێ، بەڵام بەشێکی کەمیشیان پتر (ئە)یان دەنووسی ، وەك زەکی صائب و م . نووری ... بەوێنە زەکی صائب لە وتاری ((مەسەلەی مەکتەب کردنەوە))دا [٥٠] ــ (١٥) جار ــ (ئە)ی بەکارهێناوە ، کەچی تەنیا جارێك (دە)... م . نووریش لە وتاری ((ماکینەی چاپ))دا [٥١] ــ (١٧) کەڕەت (ئە)ی نووسیوە و تەنیا دوو جار (دە) ...

---

(٤٦) مستەفا پاشا ، حەسەب حالی دووەم ، ((بانگی کوردستان)) ، سالی ١ ، ژ ٢ ، ٢١ ی ئابی ١٩٢٢ ، ل ١ــ٢ .

(٤٧) مستەفا پاشا ، ئەحوالی ضابطانی کورد ، ((بانگی کوردستان)) ، سالی ١ ، ژ ٤ ، ٢٨ ی ئابی ١٩٢٢ ، ل ١ــ٢ .

(٤٨) ڕەفیق حیلمی ، بۆ کوردان ، ((بانگی کوردستان)) ، سالی ١ ، ژ ٢ ، ١٤ ی ئابی ١٩٢٢ ، ل ٣ .

(٤٩) عەلی کەمال باپیر ، تەربیەی ئەولاد ، ((بانگی کوردستان)) ، سالی ١ ، ژ ٥ ، ٤ ئەیلوول ١٩٢٢ ، ل ٢ــ٣ .

(٥٠) زەکی صائب ، مەسەلەی مەکتەب کردنەوە ، ((بانگی کوردستان)) ، سالی١ ، ژ ٢ ، ١٤ ی ئابی ١٩٢٢ ، ل ١ــ٣ .

(٥١) م . نووری ، ماکینەی چاپ ، ((بانگی کوردستان)) ، سالی ١ ، ژ ٣ ، ٢١ ی ئابی ١٩٢٢ ، ل ٣ــ٤ .

ژمـاره (١) و (٢)ی ڕۆژنامـەی ((تێگەیشـتنی ڕاسـتی)) لـە مەسـەلەی بەکارهێنانی (دە) و (ئە)دا چاوخەڵەتێنن ، چونکە وا نیشان دەدەن ، کـە نووسـەرانی ئـەو ڕۆژنامەیـە لایـەنگیری بـەکارهێنانی (ئـە) بووبـن ، بـەڵام تەماشـاکردنی ژمارەکـانی دی ئـەو تەمـە دەوەتێنێتـەوە و ئـەوەمان پێدەسەلمێنێ ، کە د. کەمال مەزهەر ورد لـەو کێشـەیەی کۆڵیوەتـەوە و ڕاست بـۆ ئـەوە چـووە کـە ((تێگەیشـتنی ڕاسـتی)) زۆر جـار (دە)ی وەك خۆی هێشتۆتەوە و جارویاریش کردوویە بە (ئە)[٥٢] .

چاوخەڵەتێنی ژمـارە (١) و (٢) لەوەدایـە ، کـە شـێوەی (ئـە)یـان لـە (دە) کەمێك پتر تێدا بـەکارهێنراوە . بـۆ نموونـە لـە ژمـارە(١)دا پـازدە (ئـە) و چـواردە (دە) هەیـە ؛ ژمـارە (٢) ــ شـەش (ئـە) و پێنـج (دە)ی تێدایە . کـەچی لـە ژمـارە (٣)وە ئـەم دیاردەیـە نـەك هـەر بەپێچەوانـەوە دەبینـین ، بـەڵکو تـا پـتر بـەرەو دوا ژمارەکانیشـی بڕۆیـن ، نیسـبەتی بەکارهێنانی (دە) زیـاد دەکا و (ئە) بەرەو کەم بوون دەچێ . بەوێنـە لـە ژمارە (٣)دا یازدە (ئە) و هەژدە (دە) هەیە ؛ ژمـارە (٤) ــ چـوار (ئـە) و پـازدە (دە)ی تێدایـە ؛ لـە ژمـارە (١٠)دا ــ چـوار (ئـە) و نـۆزدە (دە) دەبینـرێ ؛ شـەش (ئـە) و چـل و حـەوت (دە) لـە ژمـارە (٦٥)دا بـەرچاو دەکەوێ[٥٣] .

---

(٥٢) د . کەمال مەزهەر ، ((تێگەیشـتنی ڕاسـتی)) و شـوێنی لـە ڕۆژنامەنووسـی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ١٥٢ـ١٥٣ .

(٥٣) ئەو (ئە)یانەش کە لە دوا ژمارەکاندا دەبینرێن ، بـە زۆری لـە وشەی (ئەڵێ) دان .

من وای بۆ دەچم ، مێجەر سۆن (ئە)ی پێخۆش بوویێ ، بەڵام زوو لەوە تێگەیشتبێ ، کە بۆ زمانی ئەدەبی و نووسین شێوەی (دە) لەبارترە [54] . ئەگەرچی لە ئاخاوتنی ئێستای سلێمانیدا تەنیا (ئە) بەکاردەهێنرێ و (دە) بەتەواوی لەبیرچووەتەوە ، بەڵام لەبەر ئەوەی گۆڕانێکی شێواوە و سەرەڕای ئەوەش ، چونکە نەك هەر لە دیالێکتی ژوورووودا ، بەڵکو لە زوربەی بەشە دیالێکتەکانی دی خوارووشدا هەر شێوەی (دە) ماوەتەوە ، بۆیە ڕاست وایە لە زمانی ئەدەبی و نووسیندا واز لەو جۆرە تایبەتی‌یە ناوچەییانە بهێنرێ . شایانی باسە ، کە مامۆستا تۆفیق وەهبیش لە هەمان ڕادایە و بەو بۆنەیەوە دەڵێ : پێویستە ((لەباتی (ئە)ی پێتە قاڵبی (دە) بەکاربێنین)) [55] .

٢ـ د > ی ـ y

ئەمە لە حاڵەتێکدا ڕوودەدات ، کە بکەوێتە نێوان دوو بزوێنەوە :

بادان > بایان
دادان > دایان
لە سەرمادا > لە سەرمایا
لە دنیادا > لە دنیایا
بادەم > بایەم

---

(٥٤) مێجەر سۆن لەو وتارەیدا ، کە لە ڕۆژنامەی ((پێشکەوتن))دا بڵاوی کردووەتەوە ، بە دەگمەن شێوەی (ئە)ی بەکارهێناوە . جا ئەمەش بەڵگەیێکی پتەوە ، کە ناوبراو شێوەی (دە)ی پەسەند کردبێ .

(٥٥) تۆفیق وەهبی، سەرچاوەی ناوبراو ، ئەسڵی پێتە قاڵبی شێوەی سلێمانی ، ل ٣١ .

ماده > مایه

.... هتد .

....(٥٦)

٣ـ د > ت

بەتایبەت کە دەکەوێتە کۆتایی وشەوە . وەك :

ئەوەد > ئەوەت

سەد > سەت

مەهاباد > مەهابات

کرد > کرت

....هتد .

٤ـ د > و

قەد > قەو

بەد > بەو

---

(٥٦) پێویستە پەنجە بۆ ئەوەش ڕابکێشین ، کە لە هەندێ وشەی وەك (داخۆ،داخوا...)دا (د) دەبێ بە (ئـ) یان (ی ـ Y ) :

داخۆ > ئاخۆ ـ یاخۆ

داخوا > ئاخوا

داخوا دەروونی شەق نەبووە ( پردی سەرشەقام ) ؟
پیر و قوتادە تەن نەبووە ( داری پیرمەسوور ) ؟
( نالی ، ل ١٨٤ ، د ٥ )

بەهارێکی کە داخۆ بێ ، نەیێ ، هەی بێن و شینێ کەین
فەلەك هەر شینە ، سەحرا شینە ، کێو و لێوی جۆ شینە
( مەحوی ، ل ٢٨٢ ، د ٢ )

ئایا بە جەمع و دائیرەیە دەوری ( کانی با ) ،
یاخۆ بووە بە تەفریقەیی شۆڕش و نوشوور ؟
( نالی ، ل ١٦٨ ، د ١ )

٥ـ د > گ

دەمێ بە دوای دەنگی (ن)دا دێت . وەك :

مەند > مەنگ

دەربەند > دەربەنگ

ئەوەندە > ئەوەنگە

...هتد (٥٧)

ـ ٤ ـ

## ویکچــواندن ـ Assimilation

ویکچواندن لە ئەنجامی کار لە یەکدی کردنی کشانەوە و هەڵمەتی دەنگە دراوسێکاندا ، کە قورسایی‌یان لەسەر یەکدی هەیە ، پەیدا دەبێ . وشەی (assimilatio)ی لاتینی خۆی دەتوانێ ببێتە نموونەی ویکچواندن . ئەم وشەیە لە : (assimulo) ـــ ( وێکیان دەچوێنم ، یەکیان دەخەم )ەوە دروست کراوە . ئەم کردارە لە پێشگری ( ad < as) و کرداری (simulo) پێکهاتووە . ئەگەر لەگەڵ (assimilis) ـــ (لێچوو)دا بەراوردی بکەین ، دەبینین لە دروست بوونیدا پێشگر(ـ ad ): .

---

(٥٧) لەم بارەدا دوو دەنگی (ن) و (گ) تێکەڵ بەیەك دەبن و دەنگێکی پەنگ خواردووی قورسی ناقۆڵا دەردەبڕێ .

هەر لەم بۆخەدا هەندێ ئاخێوەر بەشێك لەو وشانە بەرەو سووك بوون دەبەن ـــ واتە (د)ەکەی تێ‌دەچوێنن و دەڵێن : دەربەن ، ئەوەنە ، گوڵبەن ...

دەبێ ئەوەش لەبیرنەکەین ، کە (د)ی هەندێ لەو جۆرە وشانە ، بەو چەشنەی هەن ، بە ئاسایی دەوترێن ، وەك : هێندە ، بەندە ، کەند ...

(ad - similis) هەیە . کۆنسۆنانتی ( d)ی پێشگر بە تەئسیری هەڵمەتی دەنگی ( s) ئاوازەدارێتی و کۆسپەکی لە دەست دەدا ... وێکچواندن بریتی‌یە لە کارتی‌کردنی دەنگەکانی دراوسێ لە کۆمەکی وتندا ، پتریش لە هەر شت کۆنسۆنانت لە ڕووی ئاوازەداری و کپی ؛ نەرمی و توندی‌یەوە دەکەوێتە ژێر باری کارتی‌کردنەوە .

وێکچواندنی هەمەکی ( الکلی ) و هەندەکی ( الجزئی ) هەیە . وێکچواندنی هەمەکی بەو حاڵەتە دەوترێ ، کە هەردوو دەنگەکە بە تەواوی وەك یەکیان لێ بێت . بۆ نموونە ( کردتان ) بە (کرتتان) تەلەفوز دەکرێ ــ واتە (د) بە کارتی‌کردنی (ت)ی دوایەوە ، دەبێ بە (ت) . لێرەدا لە سەرێکەوە دەنگی (د) لە ئاوازەداری‌یەوە دەبێ بە کپ و لە سەرێکی دی‌یەوە وەك (ت) ی دواوەی لێ دێ . وێکچواندنی هەندەکی (ناتەواو) ، بەو حاڵەتە دەوترێ ، کە لە یەك ڕووەوە گۆڕان بەسەر یەك دەنگدا بێ . بەوێنە لە وشەی ( گەستی )دا (ز) تەنیا لە باری کپ بوونەوە کەوتووتە ژێر کارتی‌کردنی (ت)ەوە و بووە بە (س) ، نەك بە (ت) .

کاری وێکچواندن لە ڕووی ئاراستەکردنیشەوە دوو جۆرە : ڕاستەوخۆ و پێچەوانە . لە حاڵەتی وێکچواندنی ڕاستەوخۆدا قورسایی هەڵمەت لە کۆنسۆنانتی پێشەوە بۆ کشانەوەی ئەو کۆنسۆنانتەی بە دوایدا دێ ڕوودەدات ... لە حاڵەتی وێکچواندنی پێچەوانەشدا کشانەوەی کۆنسۆنانتی دواوە دەکەوێتە سەر هەڵمەتی کۆنسۆنانتی پێشەوەی . بەوێنە لە زمانی ئینگلیزیدا نیشانەی ( s )ی بەدوا دەنگی ئاوازەداردا وەك ( z) دەوترێ: Handz < Hands ؛ readz < reads ... و ئەمە وێکچواندنی ڕاستەوخۆیە . بۆ نموونەی پێچەوانەش ، ئەوەیە لە زمانی کوریدا ، کە دەنگی کپی (ش) لەبەردەم هەندێ دەنگی ئاوازە داردا وەك

(ژ) دەوترێ : هەشت > هەژدە ...[٥٨]

## ١ـ وێکچواندنی هەمەکی (الکلی) ـ Complete assimilation

ئەم حاڵەتە کە بە زۆری لە شێوەی سلێمانیدا دەبیسترێ و گەلێ دەنگ دەگرێتە خۆ ، کە لە نێوانیاندا فۆنێمی (د) ـ واتە شەوەی مەبەستی ئەم لێکۆڵینەوەیامانە ـ پتر ئەو گۆڕانکارییەی بەسەردا دێ :

أ ـ لە وشەیێکی ئاسادەدا گەر مۆرفێمی یەکەم کۆتایی بە دەنگی ( ز ، م ، ڤ ، ن ، ڵ ، و ، ر ... ) هاتبێ و یەکەم دەنگی مۆرفێمی دووەمی (د) بێ ، ئەوە ئەو (د)ە ، وەك ئەو دەنگانەی مۆرفێمی یەکەمی لێ دێ :




---

(٥٨) سەرەتایێکی زمانناسی (بەرگی یەکەم) ، سلێمانی ، ١٩٩٨ ، ل ٢٩٢ـ٢٩٣ ، (میدیا لە ڕووسییەوە وەریگێڕاوەتە سەر کوردی) .

(٥٩) (حەڤڤە) پاش هەندێ گۆڕان ئەم قاڵبەی ئێستای وەرگرتووە . ئەم وشەیە بە ئەس ... لە (حەفت + دە) پێکهاتووە ، دەنگی (ت)ی تێچووە ... ئەوجا ک ... ی کپی (ف)ی ،کە کەوتووەتە پێش کۆنسۆنانتی ئاوازەداری (د)ەوە ، ئاوازەدارێتی وەرگرتووە ـ واتە بووە بە (ڤ) :

> حەوردە > حەڤدە

بە ... ر ئەمانەشدا لە شێوەی سلێمانیدا بەر یاسای گونجاندنی هەمەکی ... رتووە و بووە بە (حەڤڤە) .

ب ــ دەنگی (د) نەك هەر كە دەكەوێتە دوای ئەو دەنگانەی ناومان بردن ، بەر یاسای گونجاندنی هەمەكی دەكەوێ ، بەڵكو كاتێ لە پاش یان لە پێش دەنگی (ت) شەوە دێت ، دیسان تووشی هەمان گۆڕان دەبێ :

یەكەم ـ كاتێ لە پاش دەنگی (ت)ەوە دێت .

واتە ــ ت د > دد . وەك :

ماتدان > ماددان

خەتدار > خەددار

....(٦٠)

دووەم ــ دەمێ دەكەوێتە پێش دەنگی (ت)ەوە :

واتە ـ دت > تت

كردتان > كرتتان

بردتان > برتتان

...(٦١)

---

(٦٠) شایانی باسە ، مامۆستا (طالب حسین علی) دەربارەی وێكچواندنی هەمەكی ، كە ئەو بە ( گونجانی تەواو ) ناوی بردووە ، زانیاریی باشی تۆمار كردووە ( بڕوانە : فۆنۆلۆجی كوردی و دیاردەی ئاسان بوونی فۆنیمەكان لە زاری سلێمانیدا ، نامەی ماجستێر ، هەولێر ، ١٩٨٩ ، ل ٤٩ ــ ٥٠ ) . وێڕای باسی ئەو كێشەیە ، هەر لە هەمان بەشی دووەمی نامەكەیدا ، گەلێ بار و دیاردە و یاسای دی فۆنۆلۆژی یادداشت كردووە و ، ورد و زانایانە لە زۆربەیانی كۆڵیوەتەوە . ( ل ٤٠ ـ ٩٥ ) .

(٦١) ڕەنگە خراپ نەبێ ، گەر حاڵەتی یەكەم بە گۆڕانی بەرەو پێشەوە ناوبەرین و ، ئەوەی دووەم بە گۆڕانی بەرەو دواوە .

### ٢ــ وێکچواندنی هەندەکی (الجزئی) ــPartial assimilation

لە وێکچواندنـی هـەندەکی‌دا (د) لـە حاڵـەتی ڕاسـتـەوخۆدا بـەدی ناکرێ و ، تەنیا وێکچواندنی پێچەوانەی هەیە . وەك :

هەشت + دە > هەژدە [٦٢]

پشـت + دەر > پژدەر [٦٣]

... هتد .

**ـ ٥ ـ**

## ڕێککـــەوتن

دەنگـی (د) بـە دوای دەنگـی (ر)دا زۆر دێـت : بـرد ، کـرد ، مـرد ، کورد ، سارد ، دەرد ، هەرد ، وەرد ، بەرد ، گرد ، پرد ، گەردن ، ورد ،

---

(٦٢) وشەی (هەژدە) لە (هەشـت) و (دە) پێکـهاتووە . لـە سـەرێکەوە دەنگـی (ش) تێچووە ، واتە لەمەدا بەر یاسای تێچوون کەوتووە . لە سـەرێکی دیکـەوە (د) کە کۆنسۆنانتی ئاوازەدارە لەگەڵ دەنگی (ژ)دا ، کە ئـەمیش هـەر کۆنسۆنانتی ئاوازەدارە پـتر دەگونجێ ، وەك لەگـەڵ (ش)دا ، کـە کۆنسـۆنانتی کپـە . لـەم ڕووەوە یاسای گونجاندن کاری کردووە .

(٦٣) وشەی (پژدەر) لە ((پشت + دەر)) پێکـهاتووە . لـە وشـەی (پشـت)دا دەنگـی (ش) کـپ تەلـەفوز دەکـرێ . کـاتێ وشـەی (دەر)ی دەخرێتـە سـەر و (ت) تێدە ... ، (ش)ی کـپ دەبێتـە ئـاوازەدار و بـە (ژ) دەوترێـت . ئـەویش هـۆی دە ... یاسای گونجاندنە ــ واتە کاتێك (ش)ی کۆنسۆنانتی کـپ دەکەوێتـە ... ی کۆنسۆنانتی ئاوازەدارەوە ، دەبێتە دەنگێکی ئاوازەدار .

بیّگەرد ، شەوگەرد ، پەردە [٦٤]... و تێش ناچن [٦٥] ... واتە ناوتریّ :
بر ، کر ، سار ، دەر ، هەر ، وەر ، بەر ، گر ، پر ، گەرن ، ور ، بیّگەر ،
شەوگەر ، پەرە ...

ئەمە وا نیشان دەدا ، کە دوو دەنگی (ر) و (د) حەز بە خزمایەتیی یەکدی دەکەن و یەکتر دەپارێزن [٦٦] .

... [٦٧]

---

(٦٤) شان و مل و گەردنی پووتی بیّگەرد
سنگی نەرم و ، مەمکی قوتی توند وەك بەرد
( گۆران ، ل ٤٧ )
لەبەر ئەوەی بەشەرێکم زەبوونی دلّ ، هەلّبەت
حەقم بو پەردەیی شەرم و حەیام دڕی ، لام برد !
( گۆران ، ل ٧٢ )

(٦٥) بە دەگمەن نەبیّ لە چەند وشەیێکی یەکجار کەمدا حالّەتی تێچوونیشی هەیە .
وەك : زەرد > زەر ، ئارد > ئار

(٦٦) مامۆستا مەسعوود محەمەد لە وتاری ( فۆنەتیك چیمان بۆ بکا ) ، ((گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد)) ، بەرگی سێیەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٥٩٢ـ٥٩٤ و ٦٠٤ـ٦٠٥ دا لە باسی ( گونجانی تەولو )ی دەنگەکاندا لەم دیاردەیە دواوە .

(٦٧) لەبەر ئەوەی سەرجەمی سەرچاوەکانی ئەم لێکۆلّینەوەیە لە پەراوێزدا ناوبراون ، بە پێویستی نازانم لە لیستێکدا کۆیان بکەمەوە و سەرلەنوێ بیانخەمە بەر چاوی خوێنەر ... هەروەها لەو ڕایەدام ، کورتە باسێکی وەها ، کورتە و ئەنجامی ناویّ .